# نامەی

## شيخ الإسلام ابن تيمية

بۆ موسوڵمانان
لە کاتی هەڵمەتی تەتار دا

٦٩٩ کۆچی

وەختێ تەتار ساڵی **٦٩٩** بەرەو لای حەلەب هاتن ، سەربازی میسرٍ ئەوێیان جێهێشتبوو وهەر سەرباز وسوپای شام لەوێ مابوونەوە؛ شیخ الإسلام أَحْمَدُ بنُ تَيمِيةَ ـ خوای پەروەردگار ڕۆحی پاك وبێگەرد ڕاگرێ ـ ئەم نامەی نووسی.

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ تەواوی ئەو ئیماندار وموسوڵمانانەی ئەم نامەیان دەگا پێ؛

خوا لە دونیا وئاخیرەتدا چاکەیان دەگەڵکاتو، نیعمەت وبەخششی پەنهان وئاشکرای خۆیانی بەسەردا بارێنێو، سەرکەوتنێکی سەربەرزانەو فەتحێکی گەورەیان بۆ بێنێتە پێشو، لە لایەن خۆیەوە پشت وپەناو سەرخەریان بۆ بهەنێرێتو، دەستیان بە پەتی پتەوی خۆیەوە قایمکات ورِوو لە ڕێبازی ڕاستی خۆی بن.

سلامٌ عليكم ورحمة الله وبركاته ..

سوپاس وستایشتی پەروەردگار دەکەین؛ ئەو خوایەی ئەهلی حەمد وستایشەو هەموو شتێکی لە دەست دێ. لێی دەپاڕێینەوەو داوا دەکەین دروودی خۆی بەسەر هەڵبژێراو وسەفوەتی خەڵق وباشترین بوونەوەری خۆی ببارێنێ؛ محمدی بەندەو پەیامبەری — درووود وسڵاو لە خۆی وخانەوادەوی بێ ..

دیاره كه خوای گه‌وره محمدی په‌یامبه‌ری خۆی به ڕێنموونی وهیدایه‌ت ودینی حه‌ق هه‌نارده كردووه، بۆ ئه‌وه‌ی به‌سه‌ر ته‌واوی ڕێچكه‌و دینه‌كاندا زاڵ بێ وخودا خۆی به‌سه‌ر ئه‌مه‌وه شایه‌ت وشه‌هید بێ.

هه‌روا به كۆتا په‌یامبه‌ر ونێردراوانی خۆیو گه‌وره‌ی نه‌وه‌كانی ئاده‌می داناوه‌و، كتێبه‌كه‌ی چاودێر وشایه‌تی كتێبه‌كانی پێش خۆیه‌و پشتڕاستیان ده‌كاته‌وه‌و، ئوممه‌ته‌كه‌ی كردووه به باشترین ئوممه‌تی نێو خه‌ڵك، فه‌رمانی خه‌ڵك ئه‌ده‌ن به چاكه‌و ڕێ له خراپه‌و ناڕه‌وا ده‌گرن، هه‌ر ئه‌وانیشن له دوای حه‌فتا پۆلدا باشترین ورێزدارترینیان لای خوای په‌روه‌ردگار. بۆ خۆی ئه‌و دینه‌ی بۆ كامڵ وته‌واو كردوون وبێ كورتی وكه‌مایه‌سی نیعمه‌تی ده‌گه‌ڵدا كردوون وئیسلامی وه‌ك دین وئاین بۆ هه‌ڵبژاردوون. بۆیه دین وئاین نییه له دینی وان چاتر بێ؛ ئه‌و دینه‌ی په‌یامبه‌ری ئازیز پێی نێردراوه‌و، كتێب نییه له كتێبی ئه‌وان خاستر بێ‌و، وئوممه‌تیش نییه له‌وان خێرتر وپاراوتر. به‌ڵكو كتێبی ئێمه‌و په‌یامبه‌ر ودین وئوممه‌تمان له ته‌واوی كتێب ودین وپه‌یامبه‌ر وئوممه‌تان چاترن.

ئه‌وجا جێی خۆیه‌تی له‌مه‌ڕ ئه‌م نیعمه‌تانه‌ی به‌سه‌ریدا ڕژاندوون شوكرانه‌بژێر وسوپاسگوزاری په‌روه‌ردگار بن، {وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ } [١]– هه‌ر كه‌سێكی شوكربكا بۆخۆی ده‌كاو كێش سپڵه‌بێ، ئه‌وسایه په‌روه‌رنده‌ی من بێ نیازو دلاوایه.

ده‌ست به‌و نیعمه‌ته‌وه بگرن، كه هۆكاری سه‌رفرازی ونیعمه‌تی دونیا وئاخیره‌تتانه‌و، نه‌كه‌ن پشتی لێكه‌ن وكه‌مته‌رخه‌م بن له پاراستن وپارێزگاری لێكردنیداو، له جمله‌ی ئه‌و كه‌سانه بن كه نیعمه‌تی خوای په‌روه‌ردگاریان به كوفر گۆڕیوه‌ته‌وه‌و وله ڕێگه‌ی ڕاستیان هه‌ڵگه‌ڕاونه‌ته‌وه‌و ده‌ستیان داوه‌ته كار وئیشی بێ سوودی دونیایانو، سه‌رقاڵی ئه‌و ئیشانه بوونه‌و مه‌سڵه‌حه‌تی دین ودینداری خۆیان پێ له‌بیرچۆته‌وه‌و، ئاوا هه‌م دونیا وهه‌م قیامه‌تیشیان له قیس خۆ بردووه.

---

١ النمل: ٤٠

بێ گومان ئاگاتان لەو وەسفەیە خوای پەروەردگار ناویەتە پاڵ سوپاسگوزارانو، ئەو وەسفەی ناویتیە پاڵ هەڵگەڕاوان کە دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ} [٢]— موحەممەد پێغەمبەرێکەو چیتر نییە؛ لە پێش ئەویش زۆر پێغەمبەر هاتوون وچوون. ئەگەر بمرێ یا بکوژرێ، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە ؟ هەرکەسیش پاشگەزببێتەوە، زیانێك بە خودا ناگەینێ، خوا پاداشی سوپاسگوزارانی دەدا.

خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەو چەند ئایەتی پێش ئەم ئایەتەو دوای ئەم ئایەتەی لە شەڕی ئوحود دابەزاند، کە موسوڵمانان هاوڕێ وە پێغەمبەرەوە ﷺ شکانو، بەشێك پیاوچاك ونموونەی ساڵحانی ئەم ئوممەتە لەوێ کوژریان. پێغەمبەر ﷺ خۆی ودەسەیەکی کەم لەگەڵیا جێگیر مانەوە تا دوژمن دەستی گەیاندنێو ددانی پەیامبەریان شکاند ﷺ وڕوومەتیان بریندار کرد وکلاوی سەریان تێکشکاندو، لەبەردەستی پێغەمبەردا ﷺ چەند نموونەو باشترینی ئەسحابی لە پێناو پاراستنی ئەودا کوژران وبریندار بوون .. ئەلەوێ شەیتان هاوری کرد گوتی: ئەوە محمد کوژریا ! ئینجا کۆمەڵێکیان شێوانو کۆمەڵەی تر ڕایان کرد وچۆکیان شکاو پەروەرندەی پەروەردگار کۆمەڵێکیانی ڕاگرت وپێ قایم بوون.

هەروا ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر کە وەفاتی کرد ﷺ دڵ ودەروونان داچڵەکینو، پەتی ئاین لە جێ جووڵاو، خودا وا ویستی بوو کۆمەڵێکی تووشی سەرشۆڕی وزیللەت بوونەوە، تا ئەبو بەکری صدیقیان لێ پەیابوو ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ وگوتی: هەر کەس محمدی دەپەرست ئەوە محمد مرد، وهەر کەسیش خوای دەپەرست ئەوە خوا زیندووەو قەت نامرێتو، ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ}،

٢ آل عمران: ١٤٤

وەك ئەوەبوو تازە ئەبو بەکر ئەو ئایەتە بڵێتەوەو، خەڵکیش وا تاسا بوون ئەتوت هەر لەوەوە ئەو ئایەتەیان بیستبوو، کەس پێشتر نەیخوێندبۆوە.

بە وەفاتی پەیامبەریشەوە ﷺ دەستەو تایفەهایەکی مەردم هەڵگەڕانەوەو سست بوون؛

- لەوانە بەشێك هەر تەواو لە دین هەڵگەڕانەوەو،
- بەشێکی دیکەیان لە بڕێك لە دین پاشگەزبوونەوە، گوتیان: نوێژ ئەکەین وەلی زەکات نادەین.
- قەومێ تریان لە ئیخلاس ویەکتایی دینەکەی محمد ﷺ هەڵگەڕانەوەو، وەك چۆن بڕوایان بە محمد هێنابوو ﷺ ئاواش بڕوایان بە پێغەمبەرە درۆزنەکانی وەك موسەیلەمەی درۆزن وطُلَيحَةُ الأَسَدي ودرۆزنەکانی تر هێنا.

لەو سات ولەو ڕۆژگارەدا ئەو خەڵکە سوپاسگوزارەی لەسەر دیندا جێگیر وپێ قایم بوون - موهاجیران وئەنساری هاوەڵی پەیامبەر وئەو خەڵکەی دوای فەتح موسوڵمان بووبوون وگەردن ئازاکرابوون وئەعرابەکان وئەوانی دوایی وەچاکە شوێنیان گرتن - هەستان وجیهادیان کردن؛ خوای پەروەردگار وەسفیان دەکات ودەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ} [٣] — ئەی گەلی خاوەنباوەڕان ! هەرکەس لە دینی خۆی پاشگەزبێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێ وا دەخاتە ڕوو، خۆشی بوێن؛ ئەوانیش خوایان خۆش بوێ.

ئەوان ئەوە بوون کە بە جیهادی هەڵگەڕاوان هەڵسیان؛ ئەو هەڵگەڕاوانەی کە دیارە هیچ زەرەر وزیانێکیان بۆ خوای پەروەردگار نەبوو وتوانای گەیاندنی زەرەر وزیانیان نەبوو بە خوای متعال.

---

٣ المائدة: ٥٤

هەر ئایەتێکیش لە قورئاندا هاتبێ؛ پێشتر دەستەو کۆمەڵێك ئیشیان پێ کردووەو بێ گومان قەومێ تریش پێی هەڵئەستن ودەیخەنە کار لە دوادا. جا هەر کەسە لە کۆمەڵی شوکرانەبژێر وسوپاسگوزار وپێ قایمان وجێگیران بێو دەستی بە دینەوە توند بێتو لە جملەی ئەو کەسانە بێ کە خوای گەورە وپەیامبەرەکەی خۆشیان ئەون؛ جیهاد لە دژی ئەو هەڵگەڕاوانە دەکات کە دینیان وێڵ کردووەو لێی دەرچوونو، کە قبووڵیشی دەکەن بڕەکی قبووڵ دەکەنو هەندی تری دەگێڕنەوە.

کەسانێکی وەك ئەو کۆمەڵە قەومە تاوانبار وگەندەڵ وموفسیدەی لە ئەهلی ئیسلام ڕاست بوونەتەوە، کە هێندێکیان هێشتا هەر خۆ بە موسوڵمان دەزانن و وزوبان بە شایەتمانن، وەلی بێ دەست گرتنە شەریعەت وحوکمەکانی.

## ئەو خەڵکەش سەرباز وکۆمەڵیان چوار دەستەو تایەفەن :-

۞ کۆمەڵێکیان هەر بە کافری ماونەتەوە، لەو کەرەج وئەرمەن ومەغۆلانەو ..

۞ کۆمەڵێکی تریان پێشتر موسوڵمان بوونە کەچی لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوەو پشتیان لە دینی خوا کردووە؛ لەو کۆمەڵە عەرەب وفارس ورۆم وقەومانی ترو، تاوانی ئەمانەش لە لای خوا ولای پەیامبەر وئیمانداراندا گەورەتر ومەزنترەو لە جورم وجنایەتی کافرە ئەسڵی وبە ڕەچەڵەکەکان لە چەندین ڕووەوە خراپترە. ئەمانە بە دڵنیاییەوە پێویستە بکوژرێن؛ یا ئەوەی دێنەوە نێو ئەو دینەی لێی هەڵگەڕاون ولێ پاشگەزبووینەوە. ناشێ وجائیزیش نییە - بە کۆڕاوە، واتا ئیجماع — ئەوەندەی لەسەر هەڵگەڕانەوەو ریددەکەیان بن ذیممەت وپەیمان وئەمانیان [4]بۆ ببەسترێتو، هەمجار زیندان وگیراوەکانیان ناشێ بەردرێن وبە پارەو پووڵ وبە خەڵکیش لەگەڵ دوژمن ناگۆڕدرێنەوە .. گۆشتی سەربڕاویان ناخورێت وئافرەتانیان ناخوازرێن وبە بەردەش ناگیرێن، هەر کەسیشیان - چ شەڕکا یا شەڕ نەکا - ئەکوژرێت؛ چ پیر وچ کوێر وچ بەساڵاچوو بێ، بە کۆڕای زانایانەوە.

٤ (بۆ پێناسەیەکی کورتی ئەم سێ جۆر پەیمانە دەکرێ سەیری کتێبی: الفِقهُ المُيَسَّرُ فِي ضَوءِ الكِتابِ وَالسُّنَّة – ل٢٠٨ بەولاوە بکرێتەوە؛ چاپی مُجَمَّعُ المَلِكِ فَهْدٍ لِطِبَاعَةِ المُصْحَفِ الشَّرِيف).

هەروا لە قەولی جمهووری زانایان دا ژنانیشیان دەکوژرێن؛ کەچی کافری ئەسڵی بۆی هەیە پەیمانی لەگەڵ ببەسترێت‌و ئەمانی پێ ببەخشرێ، هەروەك ئەشێ بەردرێت‌و - لە حاڵەتی دەست بەسەربوون‌دا – لەگەڵ دوژمن بگۆڕدرێتەوە - کە ڕەئی جمهووری زانایانە. وە گەر کابرای کافر لە خاوەن کتێبان بوو (أَهْلُ الكِتَاب - واتا جوو ودیان) ئەشێ وئەکرێ پەیمانی (ذِمَّة)ی بۆ بنووسرێت‌و، موسوڵمان بۆی هەیە نانیان بخوا وژنیان بخوازێ. دیارە کە ژنانیشیان دووچاری کوشتن نابنەوە؛ مەگەر ئەوەی بە قەول وکردارێك شەڕ بکەن وبەشداری شەڕەکە بن – ئەمەش هەر بە ئیجماعی زانایانەوە.

هەروەك چۆن لە سوننەت‌دا ئاماژەی پێکراوەو جمهووری زانایان باسیان لێوە کردووە تەنها کەسانێکیان کە خاوەن شەڕ وقیتال وئەهلی قیتال وشەڕ کردن بن دەکوژرێن‌و، باقی تریان حوکمی کوشتنیان بەسەردا نادرێ.

بۆیە هەم لە دین وهەم لە دونیاشدا کافری هەڵگەڕاوەو مورتەد لە کافری بە ئەسڵ وبەردەوام بەسەر کوفرەکەی خۆیەوە بەدتر وناشایەستەتر وخراپترە.

دیارە ئەم دەستەش هەر خوای پەروەردگار خۆی دەزانێ چەندێك مورتەد وهەڵگەڕاوەیان تیایە.

## ئەمە دوو کۆمەڵیان ..

❁ واشیان تیایە پێشتر کافر بووەو پاشان خۆی نسبەت بە ئیسلامەوە داوە، کەچی دەستی بە شەریعەت وحوکمەکانی نەگرتووە؛ لە نوێژ وزەکات وحەجی ماڵی خوا ودەسپارێزی لە خوێن وماڵی موسوڵمانان ودەست گرتنە جیهاد کردنەوە لە پێناو خوای گەورە وسەپاندنی حوکمی جزیة وسەرانەی یەهوود ونەسڕانییەکان ... هتد.

ئەم دەستەشیان ئیجماعی موسوڵمانانی لەسەرە کە پێویستە شەڕیان لە دژدا بکرێ؛ وەك چۆن ئەبو بەکری صدیق شەڕی زەکات نەدەرانی کرد ولە ڕوویانا جەنگی. نەخێر بەڵکو ئەمانە لە چەندین ڕوو ولایەنەوە لەوان خراپتر وبەدترن.

هەروەك چۆن هاوەڵانی پەیامبەریش ﷺ بە ئەمری پێغەمبەر لەگەڵ ئەمیری ئیماندارن عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دا ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ شەڕی خەواریجیان کرد. پێغەمبەر ﷺ کە وەسفیان دەکا دەفەرمێ: "تُحَقِّرُونَ صَلَاتَكُمْ مَعَ صَلَاتِهِمْ وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنْ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ، أَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْرًا عِنْدَ اللَّهِ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" - نوێژ ورۆژووی خۆتان بەرامبەر ڕۆژوو ونوێژی ئەوان بە هیچ نازانن، ئەوان قورئان دەخوێننەوە بەڵام لە قورگیان ئەولاتر ناچێتە خوار، وەك چۆن تیر لە نێچیرەوە ڕەت ئەبێ ئاوا لە ئیسلامەوە ڕەت ئەبن ولێی سەرگەردان ویاغی ئەبن، لە هەر کوێدا تووشیان بوون بیانکوژن؛ بێ گومان هەر کەس بیانکوژێ لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی خۆی لای خوای پەروەردگار چاوەڕێیە.

هەروا دەفەرمێ: "لَوْ يَعْلَمُ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ مَاذَا لَهُمْ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ لَنَكَلُوا عَنْ الْعَمَلِ" – ئەو کەسانی شەڕ دەکەن بیانزانیایە چ خێر وموژدەیەکیان لە زاری محمدەوە ﷺ بۆ هاتووە، کۆڵیان لە کار وعەمەل دەدا. [٥]

دەشفەرموێت: "هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ شَرُّ قَتْلَى تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ خَيْرُ قَتْلَى مَنْ قَتَلُوهُ" – شەڕ وخراپترین خەڵق ومەردمن، خراپترین کوژراوی ژێر ئاسمانن، ئەوەی لەسەر دەستیان بکوژرێ باشترین وخێرترین کوژراوە.

٥ واتە خێرەکەی ئەوەندە گەورەیە پیاو شەڕیان بکاتو بە ڕوویان بجەنگێ، وەك چۆن کابرا بزانێ خێرێکی وا گەورەی هەیە بڵێ هەر ئەوەندە خێرەم بۆ بێ بەسمە !

سەرەڕای ئەو نوێژ ورۆژوو گرتن وقورئان خوێدنەوە زۆرەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان ئەکا شەڕ وقیتالیان دەگەڵ بکرێو، ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبو تالێب وهاوەڵانی هاوڕێی شەڕی ئەو قەومە دەکەنو، نەبووە کەسیان لە شەڕیان دوو دڵ بێتو ناکۆکی ئەو شەڕە بێ؛ بە پێچەوانەی شەڕەکەی ئەهلی بەسرەو شام کە هاوەڵان لەو شەڕە دوودڵ بوون ویەکدەستە نەبوون. چونکە ئەو دەستەو کۆمەڵە – واتا خەواریج – دەستەیەك بوون شەڕ وقیتال ودژایەتی موسوڵمانانیان دەکرد. جا ئەو دەستەی ئێستا ئەگەر لە بیر وباوەڕیشدا هاوڕای وان نەبن بەڵام لە کۆمەڵێ لایەن لەوان خراپترن، جگە لەوەی خەڵکانی وایان تیایە هەمان دیدی خەواریجیان بەرامبەر بە موسوڵمانان لە دڵە.

ئەمە سێ دەستە ..

۞ دەستەیەکی چوارەمی تریان هەن لەو سێی تر خراپتر، کە قەومێکی بە ناو موسوڵمانن ولە ناوی ئیسلامەتییەکە هەڵنەگەڕاینە، بەڵام لە دەست گرتنە شەریعەتەکانی ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە.

جا ئەو کافر وئەو مورتەدانەو، ئەوانی بە نێو موسوڵمان بوونەو دەسیان نەگرتۆتە شەریعەتەکانی ئیسلامو، ئەوانی لە شەریعەتەکان هەڵگەڕاونەتەوە ئەگەر لەسەر سیماو ڕوخساریشی مابن؛ هەر هەموو بە ئیجماعی موسوڵمانان پێویستە شەڕیان لەگەڵدا بکرێ تا دەست بە شەریعەتەکانی ئیسلامەوە دەگرنو تا ئەو کاتەی فیتنەو ئاشووب وئاژاوە ئەپچڕێت ودین وئاین وبەرنامە هەر هەمووی بۆ خوای پەروەردگار ئەبێتو، گوتەی خوای گەورە - کە کتێب وئەمر ونەهی وهەواڵەکانی نێو ئەو کتێبەیە - بەرز وشەکاوەترینی وشەکان ئەبێ.

ئەم قسانەش هەموو لەو کاتەیە ئەوان لە وڵاتی خۆیان بنو دەستیان بۆ کەس نەبردبێ، دەی کە دەستیان بەسەر خاکی موسوڵماناندا گرتووە - لە عێراق وخوراسان وجەزیرە ورۆم - کە هێرشیان بۆ بردوون ودەستیان بە زوڵم وتەعەداوە لێ واڵا کردوون؛ {أَلَا تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُمْ بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَوْهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ۝ قَاتِلُوهُمْ

يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ ۝ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ} [٦]- ئاخۆ ئێوه بەگژ ئەوانەدا ناچن كە لە سوێند پاشگەزبوونەوەو نیازیان وابوو پێغەمبەر لەناوخۆدەركەن؛ دەس پێشكەریش (لەشەڕێدا) ئەوان كردیان ؟ ئێوه لەوان دەترسن ؟! ئەگەر باوەڕووهێناوه، بۆ لێ‌ترسان، خودا لەوان هێژاتره ۝ ئێوه دەگژیان ڕابچن وشەڕیان بكەن؛ خودا هەر بە دەستی ئێوه ئەوان تووشی ئازار دەكاو ژێریان داخاو سەرووده‌خا بەسەریان‌داو كارێك دەكا كوڵی دڵی باوەڕداران دابمركێ ۝ ڕقی دڵیان ڕادەماڵێ‌و، خودا حەزكا هەر كەسێكی لە گوناهان دەس‌هەڵگرێ، لێی وەردەگرێ. خودا زانای لە كارزانه.

بشزانن - خوای پەروەردگار ئیسلاحتانكات - كە لەچەندین ڕێگەوه لە پێغەمبەرەوه پشتڕاست كرایەتەوه كە فەرموویێتی ﷺ: " لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلَا مَنْ خَالَفَهُمْ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ" - بەردەوام دەستەیەكی ئەم ئوممەتەم لەسەر حەق دا دەمێننەوه، تا ڕۆژی قیامەت پەكیان بە كەس نییە پشتیان تێ بكاتو یا ناكۆكیان بێ وموخالەفەیان بكاو، زەرەریان لەوان پێ ناگا - هەروەك سابیتە كە لە وڵاتی شامن ئەو كۆمەڵە.

## جا مەردم لەم فیتنەو ئاشووبە سێ دەستەو كۆمەڵن :-

- دەستەی سەرفراز وسەركەوتوو كە موجاهید وتێكۆشەرانی دژ بەو قەومە گەندەڵ وخراپەكارەن.
- دەستەی موخالیف وپێچەوانەشیان كە بریتین لەو قەومە ناحاڵییەی بەگەریان كەوتوون، كە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن.
- دەستەیەكی مُخَذِّل وساردكەرەوەیش؛ ئەو كەسانەی دەستبەرداری جیهادی ئەو قەومەن، با لە ڕووی ئیسلام وبڕواشیانەوه ڕاست ودروست بن.

---

٦ التوبة: ١٣ - ١٥

**جا پیاو با له خۆی بڕوانێ ئاخۆ له پاڵ کۆمه‌ڵه سه‌رفراز وسه‌رکه‌وتووه‌که‌دایه ، یا پشتلێکه‌ر وخاذل، ویا ناکۆك وموخالیفه‌که ؟ چونکه هیچ ده‌سته‌یه‌کی چوارەم له‌م به‌ینه‌دا نه‌ماوه !**

ئه‌وه‌ش بزانن که جیهاد کردن هه‌م خێری دونیا وهه‌م خێری ئاخیره‌تیشی پێوه‌یه‌و، ده‌ستبه‌ردار بوونی جیهادیش دۆڕانی دونیا وئاخیره‌ته، خوای په‌روه‌ردگار له کتێبی پیرۆزیدا ده‌فه‌رموێت: {قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلَّا إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ} [٧]– بێژه: ئاخۆ چاوه‌ڕێن جگه له یه‌کێ له‌و دووانه – که هه‌ر دووکیان باشه‌کانن – شتێکی ترمان تووش ببێ ؟ - مه‌به‌ست: یا سه‌رکه‌وتن وسه‌رفرازی ویا شه‌هیدی وبه‌هه‌شته، هه‌ر موجاهیدێکیش له ژیندا بێ ئه‌وه به‌ڕێزه وخاوه‌ن پاداشتی دونیا وچاکه‌ی پاداشتی ئاخیره‌ته‌وه، هه‌ر که‌سێکیشیان بمرێت ویا بکوژرێ ڕێبواری به‌هه‌شته.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێت: "يُعْطَى الشَّهِيدُ سِتّ خِصَالٍ؛ يُغْفَرُ لَهُ بِأَوَّلِ قَطْرَةٍ مِنْ دَمِهِ وَيُرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَيُكْسَى حُلَّةً مِنْ الْإِيمَانِ وَيُزَوَّجُ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ وَيوقى فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَيُؤْمنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ" - شه‌هید شه‌ش خه‌سڵه‌ت وکه‌رامه‌تی ده‌درێتێ؛ له‌گه‌ڵ یه‌که‌م قه‌تره خوێنی خوای په‌روه‌ردگار له گوناهه‌کانی ده‌بووری‌ت‌و، ومه‌نزڵگه‌ی خۆی له به‌هه‌شتا پیشان ده‌درێت‌و، به‌رگێك له باوه‌ڕ وئیمانی به‌سه‌ر شاندا ده‌درێ‌و، حه‌فتاو دوو حۆری لێ ماره ده‌کرێ‌و، له فیتنه‌و تاقیکردنه‌وه‌ی قه‌برا سه‌لامه‌ت ئه‌بێت‌و، له ترسی هه‌ره‌گه‌وره – الفَزَعُ الأَكبَر – ئه‌پارێزرێ. [٨]

ده‌شفه‌رموێت ﷺ: "إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَمِائَةَ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ الدَّرَجَةِ إِلَى الدَّرَجَةِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَعَدَّهَا اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ" - سه‌د پله له به‌هه‌شتدا هه‌ن، نێوان هه‌ر یه‌ك له‌و پلانه وه‌ك نێوان ئه‌رز وئاسمانه، خوای په‌روه‌ردگار بۆ موجاهیدانی داناون، که له پێناو ئه‌ودا جیهاد ئه‌که‌ن وتێده‌کۆشن.

---

٧ التوبة: ٥٢

٨ (خاوه‌ن کتێبه "سُنَن"ه‌کان ڕوایه‌تیان کردووه)

کەوایە بەقەد پەنجا هەزار ساڵ لە بەهەشت بەرزبوونەوەو بڵندی بۆ موجاهیدە ! کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَثَلُ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ الَّذِى لَا يَفْتُرُ مِنْ صَلَاةٍ وَلَا صِيَامٍ" - نموونەی ئەو موجاهیدەی لە پێناو خوای پەروەردگار تێدەکۆشێتو جیهاد ئەکا، وەك نموونەی ئەو کەسەیە کە خەریکی ڕۆژوو ونوێژە قەت لێیان بێ تاقەت نابێ.

هەروەها پیاوێك لێی دەپرسێ: کردارێکم پێ نیشاندە وەك جیهاد کردن وابێ لە ڕاهی خوا، فەرمووی: پێت ناکرێ، گوتی: هەر پێم بڵێ چییە ! فەرمووی: کە موجاهید لە ماڵەوە دەرچوو، ئەتوانی بەڕۆژوو بی ونەیشکێنیو، دەست بدەیتە نوێژ وسست نەبی ؟ گوتی: نا، فەرمووی: دەی ئەوەیە کە وەك جیهاد کردن وایە لە پێناو خوای پەروەردگار.

ئەم فەرموودانەش لە دوو صحیحی ئیمامی بوخاری وموسلیم وکتێبەکانی ترن.

هەروا - ئەوەی من ئاگادار بم - زانایان یەکڕای ئەوەن کە هیچ وەك جیهاد لە نێو عیبادەتە سوننەتەکاندا نییە. جیهاد هەم لە حەج باشترە هەم لە ڕۆژووی سوننەت وهەم لە نوێژی سوننەت باشترە.

سەرنگەرنشینی لە ڕای خوا لە دانیشتنی مەکەو مەدینەو بیت المقدس خێرترە؛ هەتاوەك أبو هريرة دەفەرموێت - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ: "لَأَنْ أُرَابِطُ لَيْلَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُوَافِقَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ عِنْدَ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ" – یەك شەو لە ڕای خوا سەنگەرنشینی بگرم لەکنم خۆشەویسترە شەوی قەدرم لای حەجەری ئەسوەدا بەرکەوێت ! ریباتی شەوێك ئەخاتە بەر عیبادەتی باشترین شەو لە پیرۆزترین جێگەدا.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ وئەسحابەکانی لە مەدینەدا ئەمانەوە نەك لە مەکە، بۆ کۆمەڵە هۆکار ومانایەك؛ یەکیان ئەوەیە کە لە مەدینەدا سەنگەرنشین ومُرابِطْ بوون. چونکە رِبَاطْ مانەوەی مرۆڤە لە شوێنێك دا ترسی لە دوژمن بێت ودوژمنی لێ بترسێنێ، هەر کەسیش بە نیەتی بەرگری لە دوژمنا لە شوێنی وادا بمێنێتەوە مُرَابِطْەو؛ کار وکرداری مرۆڤیش بە پێی نیەت ونیازی خۆیەتی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: "رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنْ الْمَنَازِلِ" - ڕۆژەك رباط لە ڕای خوا، لە هەزار ڕۆژی جێیانی دی باشترە. [٩]

هەروا لە صحیحی موسلیم دا هاتووە کە سەلمانی فارسی نەقڵ لە پێغەمبەر دەکا ﷺ کە دەفەرموێت: "رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ وَمَنْ مَاتَ مُرَابِطًا أُجْرِيَ عَلَيْهِ عَمَلُهُ وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ مِنْ الْجَنَّةِ وَأَمِنَ الْفَتَّانَ" - شەو وڕۆژێك سەنگەرنشینی لە ڕای خوا لە ڕۆژوو ونوێژی مانگێك خێرترە. هەر کەسیش لە رباط دا بە سەنگەرنشینی بمرێت؛ کار وکردەوەکانی دەیکردن هەمیشە بە بەردەوامی بۆی دەنووسرێن و؛[١٠] لە بەهەشتەوە ڕزق وڕۆزی بۆ ئەهەنێردرێت و لە تاقیکەرەوەکەی نێو قەبر سەلامەت ئەبێت.

ئەمە فەزڵی رِبَاط وسەنگەرنشینی بێ ئەبێ فەزڵی جیهاد چۆن بێ !

---

٩ (ئەهلی کتێبی "سُنَن"ەکان گێڕاویانەتەوەو بە صحیحیان داناوە)

١٠ وەك لە فەرموودەی تردا هاتووە دەفەرموێت ﷺ: "كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلّا الَّذِي مَاتَ مُرَابِطاً فِي سَبِيلِ اللهِ فَإِنَّهُ يُنْمى لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ وَيَأْمَنُ فِتْنَةَ القَبْرِ" - هەر مردوویەك کە دەمرێ دەفتەری کار وکردارەکانی مۆر دەکرێ. تەنها ئەو کەسە نەبێ کە لە سەنگەرنشینی دا لە ڕای خوا دەمرێت؛ ئەو کەسە کار وکردارەکانی تا ڕۆژی قیامەت گەشەیان بۆ پێ دەدرێ وزۆر دەکرێن و، لە تاقیکردنەوەی قەبر سەلامەت دەبێ.

واتە هەر ساتێك وپاداشتێکی تازەی دەگاتێ، چونکە ئەو گیانی کردە قوربانی شتێ کە بەهرەی بەسەر موسوڵمانان دا دێتەوە؛ کە ژیانی دین وئاینە بە بەرپەرچ دانەوەی هاوەڵگەر وموشریکانی دوژمنیان. (بە بڕێك دەستکارییەوە لە تُحْفَةُ الأَحْوَذِي فِي شَرْحِ جامِعِ التِّرمِذِي ل٢٥٠ – چ. دارُ الفِکر).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: "لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي وَجْهِ عَبْدٍ أَبَدًا" – تۆز وخۆڵێ لە ڕای خوا ودووکەڵی جەهەنەم هەرگیز پێکەوە بەسەر ڕوومەتی بەندەیەکدا کۆنابنەوە.

هەروا دەفەرمویێت: "مَنْ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَرَّمَهُمَا اللَّهُ عَلَى النَّارِ" - هەر کەسە لە ڕاهی خودا قاچەکانی تۆزاوی بن خوای پەروەردگار حەرامی ئەکات لە ئاگردا ڕۆچن.

ئەمە ئەو تۆز وخۆڵەی بەر ڕوومەت وقاچ کەویێت وایە، جا ئەوەی لەو زەحمەتتر؛ وەك بەفر وسەرماو قوڕ ... هتد، چۆنێکە ؟!

بۆیە خوای گەورە عەیبە لەو مونافیقانە دەگرێ کە ساردی وگەرمی دەکەنە پاساوی دواکەوتنیان لە جیهاد ودەفەرمویێت: {فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ} [١١] ئەوانەی بەوە دڵخۆشن کە لەماڵەخۆیان مانو لە هاوڕێ بوون دەگەڵ خوداو پێغەمبەری خۆیان بواردو نەیانویست کە ماڵو گیانیان لە ڕاهی خودا بەخت کەنو وجیهادکەن وتێبکۆشنو دەیانگوت: لەم گەرمایەدا دەرمەکەون. بێژە؛ ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایە، خۆ ئاگری جەحەندەم زۆر گەرمترە !

ئەوانەشی دەڵێن: لە سەرمادا نەکەن دەرچن ! دەڵێین: ئاگری جەهەنەم لەو ساردترە !

هەروەك ئیمامی بوخاری وموسلیم لە صحیحدا لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە ﷺ کە فەرموویەتی: "اشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا فَقَالَتْ: رَبِّي أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ فَأَشُدُّ مَا تَجِدُونَ مِنْ الْحَرِّ وَالْبَرْدِ فَهُوَ مِنْ زَمْهَرِيرِ جَهَنَّمَ" - ئاگر شەکوای بۆ لای پەروەرندەی بردەوە گوتی: خوایە؛ وا لە ناوا ئەفەوتێمو خۆم خەریکم ئەخۆمەوە ! خوای پەروەردگار مۆڵەتی دا دوو

---

١١ التوبة: ٨١

هەناسانی بکێشێ، هەناسەکیان لە زستان وهەناسەیەك لە هاوینا، جا ئەوپەڕی گەرمی وساردی تووشتان دێتن لە زەمهەریری جەهەنەمەوەیە. [١٢]

جا کەوابێ ئیماندار بە سەبر وئارام گرتنی لە گەرمایی ولە سەرمادا لە ڕای خودا، خۆی لە گەرمایی وساردی جەهەنەم پێ دەپارێزێ. مونافیقیش لە گەرماو سەرمای دونیا ڕادەکاو دەکەوێتە نێو گەرمای جەهەنەم وسەرمای ئەوێ وزەمهەریری !

ئەوەش بزانن - خوای گەورە ئیسلاحتانکات - کە سەرکەوتن کۆتایی ئەهلی ئیمانە وسەرەنجام بۆ ئەهلی تەقواو لەخواترس وخۆپارێزی نێو خەڵکانەو، خوای گەورەیش هاوەڵی خەڵکی لە خواترس وخۆپارێز وچاکەکارە. کەچی ئەو قەومە هەر شکاوەو ژێرکەوتوون ! خوای گەورەش بێ گومان سەریخستووین وتۆڵەمانی لێ سەندوون ودیارە کە هیچ حەول وقوەتێك بە غەیری خوای گەورە نییەو نابێ.

بۆیێ کە دڵنیا ودڵ ئارامی کۆمەك وپشتیوانی خوای گەورەو پاشەڕۆژی چاکی ئەو بن؛ {وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ} [١٣]– با سستی ڕووتان تێنەکاو خەمیش مەخۆن. هەر ئێوەن کە سەر دەکەون، ئەگەر بڕواو بە خوا هەیە.

دیارە ئەوەش کە شتێکە لێی دڵنیاین وشك وگومانمان لێی نییە سوپاس بۆ خوا.

---

[١٢] فەرموودەکە لە صحیح دا بە لەفزێکی تر هاتووە کە دەفەرموێت لە کۆتاییەکەی دا: "... فأَشَدُّ ما تَجِدونَ مِنَ الحَرّ، وأَشَدُّ ما تَجِدونَ مِنَ الزَّمْهَرير" - سەخترین گەرمای دەیبینن لە گەرمایەتیو، سەخترین سەرماشتان لە زەمهەریرییەتی. (فَتحُ الباري بِشَرحِ صَحيحِ الإِمامِ البُخاري – فەرموودەی ژ ٣٢٦٠ - ل ٣٣٠ - چ. المكتَبة السَلَفِيَّة).
(زَمْهَرِير)یش سەختی سەرماو سەرمای توندە.

١٣ آل عمران: ١٣٩

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ۝ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ۝ وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ۝ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا أَنْصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ}[١٤]

ئەی گەلی خاوەن باوەڕوان ! دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ بێژم کە لە ئازارێکی بەژان ڕزگارووکا ؟ ۝ بڕوا بە خواو بە پێغەمبەری ئەو بێنن‌و بە دارایی‌و گیانی خۆتان لە ڕای خودا تێبکۆشن؛ ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن ۝ لە گوناهانوو دەبووری‌و دەتانباتە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕواو خانووی زۆر خۆش‌و خاوێنتان لە بەهەشتی هەمیشەییدا دەداتێ؛ ئەمە دەسکەوتی گەورەیە ۝ شتێ‌تریش – کە ئێوە حەزی‌لێدەکەن – یاریدەدانێ لە خوداوەو سەرکەوتنێکی نزیکیش. ئەم مژدەیە بە باوەڕدارەکان بدە ۝ ئەی گەلی خاوەن‌باوەڕان ! یاریکارانی خودابن، وەکوو عیسای کوڕی مەریەم بە یارانی حەواری گوت: کێ بەرەوخوا دەبێتە یاریدەری من ؟ دەستەی حەواریەکان وتیان: ئێمە یاریدەری خوداین. ئەوسا لە بەرەی ئیسرائیل هێندێکیان بڕوایان هێناو هێندیکیش هەر بێ‌باوەڕ مان. ئیتر ئێمە خاوەن باوەڕەکانیانن یارمەتی کرد، تا دەرۆستی دوژمنانی خۆیان هاتن.

---

١٤ الصف: ١٠ ـ ١٤

بشزانن - خوای گەورە ئیسلاحتانکا - کە ژیانی کەسێك وگەشتنی بەم زەمانەی خوای گەورە دینی خۆیی تێ زیندوو دەکاتەوەو، دروشمی موسوڵمانان وحاڵو وەزعی ئیمانداران وموجاهیدانی تێدا ئەژیێنێتەوە، بۆ ئەوەی وەك پێشکەوتووانی ئەوەڵی موهاجیران وئەنسارِی کاتی خۆی لێبێ؛ یەکێك لە گەورەترین نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارە بۆ ئەوانەی خێر وچاکەی بۆ ویستوون. بۆیە هەر کەس لەم رۆژگارە پێی هەڵسێ؛ لە شوێنکەوتووە سەر ڕاست وبە خێرەکانی ئەوانە، کە خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لەو ڕازین وبەهەشت وباغاتی بۆ سازداون جۆباریان بەبەردادەڕواو تا هەتایە تێدادەبن و ئەمەیە دەسکەوتی گەورەو مەزن وگرینگ. ئەشێ ئیماندارانیش لەمەڕ ئەم میحنەتەیا شوکرانەبژێری خوای گەورە بکەن کە لە ڕاستیدا بەخششێکی خوایە، لەمەڕ ئەم فیتنەو ناخۆشییەی نیعمەتێکی گەورەو مەزنی لە نێو خۆدا هەڵگرتووە. تا – بە خوا – ئەگەر موهاجیر وئەنسارەکانی پێشکەوتووی - وەك ئەبو بەکر وعومەر وعثمان وعەلی وئەوانی تر - لەم سەردەمەی ئێمەدا حزووریان بوایە؛ دیارە کە جیهادی ئەم خەڵکە موجریم وتاوانبارە یەکێ لە باشترین کار وکرداریان بوو.

دیارە کە تەنها کەسێکی دۆڕاو ونەزان شەڕ وغەزایەکی وا لە قیس خۆی ئەچوێنێت؛ کەسێك کە لە بەش وپشکێکی مەزنی دونیا وئاخیرەت بێ بەش بووە، مەگەر کەسانێك خوا عوزری بۆ دانابن؛ وەك نەخۆش وفەقیر وکوێر وهاوشێوەیان. ئەگینا ئەگەر کابرا هەبوون بوو - با لە ڕووی بەدەن وجەستەوە بێ توواناش بێ - با بە پارەو پووڵ وسامانی بەشداری شەڕ وغەزاکە بێتن؛ لە صحیحین دا لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە ﷺ کە فەرموویەتی: "مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فَقَدْ غَزَا وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا" - هەر کەس شەڕکەرێك ئامادەکات وپڕچەکی بکاتو، ئەوەی لە دوای خۆی ئاگاداری ماڵ ومناڵ وخانەوادەکەی ئەبێت، بەشداری شەڕ وغەزاکەی کردووە.

ئەوەی نەداریشە – بەڵام تاقەت وتوانای شەڕی هەیە -، با خۆی بە پارەو پووڵی موسوڵمانان ئامادەکات، چ زەکات بوو یا بەخشش وخەڵات بوو، یا لە بیت المال بوو یا هەر پارەو پووڵێکی تر. هەتا ئەگەر پارەی حەرامی لا بوو وبۆی نەکرا بیگەینێتەوە خاوەنەکانی، چ ئەوەی لێیان بێ خەبەر بوو ولەم جۆر هۆکارانە، یا ئەوەتا ئەمانەت وبارمتە بوو یا سپاردەی لەبەر دەست بوون

ونەیتوانی خاوەنەكانیان بناسێتەوە؛ با لە پێناو خوای پەروەردگاردا بیانبەخشێت، چون دیارە كە بەخشینیان لە ڕای خوا ڕێ وجێی سەرف كردنیانە.

هەر كەسیش ئەهلی گوناه وتاوانی زۆر بوو جیهاد كردن باشترین دەواو دەرمانییەتی، چون خوای پەروەردگار وەك خۆی باسی كردووە گوناهەكانی دەبەخشێ، خوای تعالی دەفەرموێت: {يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ} – لە گوناهەكانتان دەبوورێت.

هەر كەسیش گەرەكی بوو خۆی لە حەرام پاككاتەوەو تۆبە بكات ونەیتوانی شتەكە بۆ خاوەنەكانی بگێڕێتەوە، با لە پێناو خوای پەروەردگار لە بڕی خاوەنەكانی وەك ئەجر وپاداشت بیبەخشێت، ئەوەش ڕێ وجێیەكی چاك وخێری نەجات ودەرباز بوونیەتی، سەرەڕای ئەو ئەجر وپاداشتی جیهادەی كە بۆی دەنووسرێ.

هەروا كەسێ ویستی بوو خوای پەروەردگار لەوەی خۆشبێ كە دەمارگیری جاهیلیەتی بووەو بانگەشەی جاهیلیەتی گوتۆتەوە؛ با ڕوو لە جیهادكات. چون ئەوانی لەسەر دەمارگیری هۆز وعەشیرەت وهەر دەمارگیرییەكی ترا بن - وەك عەشایری قەیس ویەمەن وهیلال وئەسەد وهاوشێوەیان - هەموو ئەمان بكوژ وكوژراویان لە ئاگرن؛ وەك لە صحیحدا لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە ﷺ كە فەرموویەتی: "إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ . قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ - قَالَ : إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ أَخِيهِ" – ئەگەر دوو موسوڵمان بە شمشێر ڕووبەڕووی یەك بنەوە، هەم بكوژ وهەم كوژراویان لە ئاگرە. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا؛ ئەوە بكوژەكە حاڵی بووین، ئەی كوژراوەكە بۆ ؟! فەرمووی: ئەو پەرۆشی ئەوە بوو براكەی بكوژێ. [١٥]

١٥ (لە صحیحین دا هاتووە)

هەروا دەفەرموێت: "مَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عِمِّيَّةٍ : يَغْضَبُ لِعَصَبِيَّةٍ وَيَدْعُو لِعَصَبِيَّةٍ فَهُوَ فِي النَّارِ" – هەر کەس لە ژێر ئاڵاو مەبەستێکی نادیار وگومڕادا کوژرا: بە دەمارگیری وبۆ خزم وکەسوکار وقەوم وقیلە هەڵچێ‌و، بانگەشە بۆ دەمارگیری قەوم وقیلەو کەسوکاری خۆی بکا، ئەوە سەرەنجامی لە ئاگرە. ١٦

دەشفەرموێت ﷺ: "مَنْ تَعَزَّى بِعَزَاءِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ فَأَعِضُّوهُ بِهَنِ أَبِيهِ وَلَا تَكْنُوا، فَسَمِعَ أَبَيُّ بْنُ كَعْبٍ رَجُلًا يَقُولُ : يَا لِفُلَانٍ فَقَالَ : اعْضُضْ أَيْرَ أَبِيك فَقَالَ : يَا أَبَا الْمُنْذِرِ ; مَا كُنْت فَاحِشًا . فَقَالَ بِهَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ". ١٧

هەر کەسە خۆی وەپاڵ ڕیشەو بانگەشەی ئەهلی جاهیلیەتەوە بات، بڵێن: بچۆ عەورەتی باوکت بگەزە، ناوی ئەو ئەندامە بێنن ڕاشکاوانە، بە سەرناو مێژنی. دی أُبَیُّ بنُ کَعْب – ڕەزای خوای لێبێ – گوێی لە کابرایەك بوو دەیگوت: هۆ بۆ فلانی، هاوار بۆ فلانی، وتی: بچۆ کێری باوکت بگەزە ! کابرا گوتی: بابی مُنذِر خۆ تۆ بەدەڕەوشت وزمانپیس نەبووی ! فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ئاوای فەرمان پێکردووین. ١٨

---

١٦ (ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە)

١٧ (ئیمامی ئەحمەد لە موسنەد دا ریوایەتی کردووە)

١٨ کابرا ئەلەوێ ئەو ڕەگ وڕیشەی زۆر بە گەورەو گرنگ زانیوەو کە هاواری کردووە بەو ڕیشەو فیزەوە هاواری کردووە، کە عادەتی جاهیلییەکان بووە کەسێك لە هۆزێك با هاواری بۆ هۆز وعەشرەتی خۆی دەبرد وهۆ فلانی ورۆ فلانی دەکرد، جێگەی خۆی بووە قسەیەکی وا توندی بە گوێدا بدرێ تا زەینی بێتەوە سەرخۆی.

وەك ئیمامی اِبنُ القَیِّم ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمێ: باسکردنی عەورەتی باوکی ئالێرە - ئەو ئەندامەی کە لەوەوە هاتۆتە بوون - باشترە بەخۆ بێتەوەو خۆی وە بانگەشەی جاهیلیەت ونەفامی بە گەورە نەزانێ‌و، بزانێ کە ناشێ پێگەو جێگەی خۆی تێپەڕ بکاتن. (زادُ المَعاد في هَديِ خَيرِ العِباد – ٢/٤٣٨).

ئیمامی بەغەوی دەفەرموێت: ئاشکرا وتنی ئەم لەفزە ناحەزەش لە بری ئەوەیەتی کە خۆی داوەتە پاڵ هۆز وعەشرەت وفەخر وفیز ونازی بەوان لێداوە. (شَرْحُ السُّنّة: ١٣/١٢١).

مانای ئەوەی کە دەفەرموێت: "مَنْ تَعَزَّى بِعَزَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ" – هەر کەسە خۆی وەپاڵ ڕیشەو بانگەشەی جاهیلیەتەوە بات - واتە وەك جاهیلیەکان هاوارکات وبڵێ: هۆ قەیس، هۆ یەمەن، هۆ هیلال، هۆ ئەسەد ... ! [١٩]

هەر کەسەشی دەمارگیری بۆ ئەهلی وڵاتی خۆی یا بۆ مەزهەب وڕێچکەو یا بۆ کەسوکار ونزیك وهاوڕێکانی بوو سیفەتەکی جاهیلیەتی هەڵگرتییە ! تا ئیمانداران وەك چۆن خوای گەورە ئەمری کردووە وا دەبن‌و دەست بە پەتی خۆیەوە دەگرن ولەسەر کتێب وسوننەتی پەیامبەر قایم دەبن. چونکە کتێبیان یەك کتێبە ودینیان یەك دینەو پەیامبەریان یەکەو خواو پەروەردگاریان یەکەو جگە لەو هیچ خوداو پەروەردگارێك بوونی نییە، لە دنیاش‌و لە قیامەتیش سوپاس هەر تایبەتی ئەوە؛ فەرمان هەر فەرمانی ئەوەو بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ۝ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ۝ وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ۝ وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ...}. [٢٠]

ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ! چۆن پێویستە، ئاوا لە خوا بترسن‌و هەر بە موسوڵمانی بمرن ۝ هەمووڵاتان دەس دەڕشتەی پەیمانی خوا وەرێنن‌و بڵاو مەبن. بیر لەو چاکە بکەنەوە کە خودا دەربارەی کردن: کە ئێوە دژ بە یەکتر بوون، بە دڵ کردوونی بە هۆگر؛ لە سایەی چاکەی ئەمەوە، ئێستا لێکتر بوونە براو لەسەر لێواری ئاگر بوون هەر ئەو بوو ڕزگاری کردن. خوا ئاوا نیشانانی

١٩ قەیس ویەمەن وهیلال وئەسەد ناوی عەشرەت وهۆزن.

٢٠ آل عمران: ١٠٢ ـ ١٠٦

خۆی بۆ ئێوه ڕوون دەکاتەوە؛ بەڵکوو ڕێگا بدۆزنەوە ۞ دەبێ لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك ببن، فەرمان بە چاکە بدەن‌و ڕێ لە خراپە ببەستن؛ هەر ئەوانەش ڕزگاردەبن ۞ نەکا وەك ئەوانە بکەن کە لێکتر جیابوونەوە لە دوای ئەوەی نیشانەی ئاشکرایان دیت، ئەوسا کێشەیان تێ‌کەوت. بۆ ئەوانە ئازارێکی گەورە هەیە ۞ لەو ڕۆژەدا کە هێندێك ڕوویان سپی وهێندێك‌تر ڕەش داگەڕاون ...

ابن عباس ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ: "تَبْيَضُّ وُجُوهُ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ وَتَسْوَدُّ وُجُوهُ أَهْلِ الْفُرْقَةِ وَالْبِدْعَةِ" - ڕووی ئەهلی سونەت وجەماعەت سپی دەبن وڕووی ئەهلی ناکۆکی وپەرتەوازەیی وبیدعەت ڕەش هەڵدائەگەڕێن.

بۆیە بۆ خاتری خوا دەستتان بە جەماعەت ویەکیەتیتان لە فەرمانبەرداری خوا وپەیامبەر وجیهاد کردن لە ڕای خوادا قایم بێ‌و، خوای گەورەش بە دڵ هۆگروو دەکاو پێکدێن ولە گوناه وتاوانتان خۆش دەبێ وخێری دونیا وئاخیرەتتان بە نسیب دەکات.

خوای پەروەردگار ئێمەو ئێوەش یارمەتیدا لە فەرمانبەرداری وعیبادەتی ئەودا بین‌و، لە ڕێچکەو ڕێبازی تاوانمان لاداو، لە دونیا ولە ئاخیرەتدا چاکەمان بکاتە بەش ولە سزای ئاگرمان بپارێزێت‌و، ئێمەو ئێوەش بخاتە نێو ئەو خەڵکەی لێیان ڕازییەو بەهەشتی نیعمەتی بۆ هەڵگرتوون. خوای پەروەردگار خۆی بەسەر هەموو شتێکا زاڵ وبە توانایەو خودامان بێ بەسمانەو چاترین پشت وپەنامان تەنیا ئەوە.

والحمد لله وحده وصلى الله على سيدنا ونبينا محمد وآله وصحبه وسلم. [21]

---

٢١ سەرچاوە: کۆکراوەی فەتواکانی شیخ الإسلام ابن تيمية (مَجْموعُ الفَتاوى).
جلدی ٢٨؛ كِتابُ الفِقه - بەشی هەشتەمین: الجِهاد
ل٤١٠ - ل٤٢٣ (بە پێی بەرنامەی المكتبة الشّاملة - کە موافقی چاپەکەیە؛ چاپی مُجَمَّعُ المَلِكِ فَهْدٍ لِطِبَاعَةِ المُصْحَفِ الشَّرِيف).